# چۆنێتی لەبەرکردنی

# قورئان و دووبارەکردنەوەی

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

ئامانج محمود محمد أمين

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، درود بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ ، و هاوەڵە بەڕێزەکانی رضي الله عنهم ، و هەموو ئەو موسوڵمانانەشی کە لە دوای ئەوانەوە هاتوون بە چاکی و بە باشی شوێنیان کەوتوون تاوەکو ڕۆژی قیامەت .

دواتر :

لەبەرکردنی قورئان پلەوپایەیەکی بەرز و گەورەی هەیە لە دونیا و قیامەتدا ، لە دونیادا خودای گەورە کۆمەڵێك پاداشتی بۆ داناوە ، وە لە قیامەتیش کۆمەڵێکی گەورەتر و زیاتر پاداشتی دیکەی بۆ داناوە ، جا خۆشبەختی دونیا و قیامەت بۆ ئەو کەسەی پەیام و وتەی پەروەردگاری لە سینگدا هەڵگرتبێت ، و لەگەڵی بژێت بە دڵ و کردار و گوفتار .

ئەم بەرنامەی لەبەرکردنە لە بنەڕەتدا بۆ خودی خۆم دامنابوو ، دوای گەڕان و بەدواداچوونێکی دوور و درێژ بەناو دەیان کتێبـی نووسراو دەربارەی چۆنێتی لەبەرکردنی قورئان و دووبارەکردنەوەی ، بەڵام بە باشمزانی بڵاویبکەمەوە ڕەنگە سوودی هەبێت بۆ کەسێك بیەوێت قورئان لەبەربکات ، یاخود یارمەتیدەری مەعنەوی بێت بۆ کەسێك بەدوای بەرنامەیەکی هاوشێوەدا بگەڕێت .

چونکە بۆ کەسێکی دیاریکراو نووسراوە دەکرێت لەگەڵ هەندێك کەسدا نەگونجێت ئەم بەرنامەیە ، دەتوانرێت بەشێوازێك دەستکاری بکرێت لەگەڵ کەسەکەدا بگونجێت ، بەڵام ئەم شێوازەی پەیڕەوم کردووە بۆ دانانی بەرنامەکە پوختەی دەیان کتێبـی ئەم بوارەیە ، کە زۆرینەی کتێبەکان ئەو کتێبانەن کە خەڵکانێکی زۆر بەهۆیانەوە قورئانیان لەبەرکردووە ، هەروەها کتێبەکان هەیانبووە زیاتر لە (٦٠٠) لاپەڕە بووە ، هەشیان بووە چەند لاپەڕەیەك بووە .

هەرکەسێك بتوانێت ئەم بەرنامەیە بە جددی و ١٠٠٪ جێبەجێی بکات ئەوا زۆر ئاسان دەبێت لەسەری کە قورئان بە جوانی و چاکی لەبەربکات ، هەر کەمتەرخەمییەك لە جێبەجێکردنی بەرنامەکەدا ناتەواوی دروست دەکات لە کرداری لەبەرکردنەکەت .

داواکارم لە پەروەردگاری بەرز و پیرۆز کە نیعمەتی لەبەرکردنی قورئانمان بە نسیب بکات ، بمانکاتە ئەهلی قورئان ، لەگەڵ قورئان ئاشنامان بکات ، قورئان بکاتە بەهاری دڵەکانمان ، شارەزامان بکات لە قورئان ، لە کۆتاییدا قورئان بکاتە شەفاعەتکار و تکاکارمان ، قورئان ببێتە بەڵگە بە دەستمانەوە نەوەك ببێتە بەڵگە بەسەرمانەوە .

هەر بەڕێزێك پێشنیارێك یاخود ڕەخنەیەکی هەبوو لەسەر بەرنامەکە ئاگادارم بکاتەوە - لە ڕێی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکەوە کە هەر بەناوی خۆمەوەیە - سووپاسی دەکەم ، بۆ ئەوەی بەرنامەکە زیاتر دەوڵەمەند ببێت .

ئامانج محمود محمد أمين

٧ / ذي الحجة / ١٤٤٢ - ١٦ / ٧ / ٢٠٢١

کەلار – کوردستان

# هەندێك لە پلە و چاكە و فەزڵی قورئان لەبەركردن

هەندێكی زۆر كەم لە پلە و فەزڵ و چاكەكانی قورئان لەبەركردن باسدەكەین بەڵكو ببێتە هۆی هاندانی كەسانێك كە دوودڵن لە لەبەركردنی قورئان یاخود كەمتەرخەمن :

**١- دەبیت بە كەسانی تایبەتمەند لای خودی گەورە :**

روى الإمام ابن ماجه رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٢١٥] عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ –وصححه الإمام الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ– ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :

(( « إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ » قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هُمْ ؟ قَالَ : «هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ » )) .

[واتا] : (( « بەڕاستی خودای گەورە ئەولیاو و خۆشەویستی خۆی هەیە لە ناو خەڵكیدا » وتیان : كێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی « ئەوانە ئەهلی قورئانن ، ئەوانە ئەولیاو و خۆشەویستی خودای گەورە و تایبەتمەندەكانی خودان » )) .

**٢- دەتوانیت حەسوودی بەریت بە كەسێك قورئان لەبەرە بەوشێوەیەی لە فەرموودەكەدا هاتووە :**

روى الإمام البخاري رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٥٠٢٦] عن أَبِي هريرةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ : أَنَّ رسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :

(( لَا حسدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ : رجل علَّمه اللَّهُ القرآنَ ، فَهو يتْلُوه آناءَ اللَّيْلِ وآناءَ النَّهار ، فَسَمِعَهُ جار لَه ، فقَالَ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مثْلَ ما أُوتِيَ فُلَانٌ ، فَعَمِلْتُ مثْلَ ما يعمل . ورجل آتاه اللَّهُ مالًا فَهو يهْلِكُهُ فِي الحق ، فَقَالَ رجل : لَيْتَنِي أُوتِيتُ مثْلَ ما أُوتِيَ فُلَانٌ ، فَعَمِلْتُ مثْلَ ما يعمل ))

[واتا] : (( حەسوودی نییە جگە لە دوو شت نەبێت : پیاوێك خودای گەورە قورئانی فێركردبێت ، ئەویش دەیخوێنێتەوە بە شەو و ڕۆژ ، دراوسێیەكی گوێی لە دەنگی دەبێت ،

دەڵێت : خۆزگە منیش ئەوەم پێدەدرا کە بە فلان دراوە ، منیش ئەوەم دەکرد کە ئەو دەیکات . پیاوێکیش خودای گەورە ماڵێکی پێبەخشیوە لە حەق و خێردا بەکاریدێنیت ، پیاوێکیش دەڵێت : خۆزگە منیش ئەوەم پێدەدرا کە بە فلان دراوە ، منیش ئەوەم دەکرد کە ئەو دەیکات)) .

٣- ڕێزگرتن لەو کەسەی قورئانی لەبەرە بە گەورەدانان و ڕێزگرتنە لە خودای گەورە :

روى الإمام أبو داود رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٤٨٤٥] عن أَبِي موسى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ –وحسنه الإمام الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ– ، قَالَ : قَالَ رسولَ اللَّه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :

(( إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِى الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ ، وَإِكْرَامَ ذِى السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ )) .

[واتا] : (( بەڕاستی لە بە گەورەدانان و ڕێزگرتنی خودای گەورەیە ڕێزگرتن لە ڕیش سپی موسوڵمان ، و ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە کە نە زیادەڕەوی تێدا دەکات و نە کەمتەرخەمیشی تێدا دەکات ، هەروەها ڕێزگرتن لە دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر )) .

٤- باشترینی موسوڵمانان ئەوانەن کە قورئان فێردەبن و فێری خەڵکیشی دەکەن:

روى الإمام البخاري رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٥٠٢٨] عن عثمانَ بنِ عفَّانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ : قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :

(( إِنَّ أَفْضَلَكُم من تَعَلَّمَ القُرآنَ وعَلَّمَهُ )) .

[واتا] : (( باشترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێری قورئانی پیرۆز دەکات )) .

**٥- قورئان شەفاعەتكار و تكاكارە لە قیامەت بۆ خاوەنكەی :**

روى الإمام مسلم رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٢٥٢ (٨٠٤)] عن أَبي أُمامةَ الْبَاهلِيِّ رضي الله عنه قَالَ : سَمِعْتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم يقُولُ :

(( اقْرءوا الْقُرآنَ فإِنَّهُ يأْتِي يوم الْقِيامَة شَفيعًا لأَصْحابه )) .

[واتا] : (( **قورئان بخوێننەوە بەڕاستی قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا دێت وەكو شەفاعەتكار و تكاكار بۆ خاوەنەكەی** )) .

**٦- لە بەهەشتدا چەند ئایەتت لەبەربێت ئەوەندە پلە بەرزدەكرێیتەوە :**

روى الإمام ابن ماجه رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٣٧٨٠] عن أَبِي سَعيد الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه -وصححه الإمام الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ- ، قَالَ : قَالَ رسولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم :

(( يقَالُ لصَاحِبِ الْقُرْآنِ إِذَا دخل الْجَنَّةَ اقْرأْ واصعدْ ، فَيقْرأُ ويصعدُ بِكُلِّ آيَة درجةً حتَّى يقْرأَ آخِرَ شَيْءٍ معه )) .

[واتا] : (( **ئەو كەسەی قورئانی لەبەرە كاتێك دەڕواتە ناو بەهەشتەوە پێی دەوترێت كە قورئان بخوێنەوە و بەرزببەوە ، ئەویش قورئان دەخوێنێت و بەرزدەبێتەوە بە هەر ئایەتێك كە دەیخوێنیێەوە تاوەكو كۆتا ئایەت دەخوێنێتەوە كە لەبەری كردووە لە دونیادا** )) .

**٧- ئەو كەسەی قورئانی لەبەرە لە قیامەتدا جلوبەرگ و تاجی ڕێزلێنانی لەسەر دەكرێت ، و خودای گەورەش لێی ڕازی دەبێت ، و بە هەر ئایەتێك پاداشتێكی بۆ دەنووسرێت:**

روى الإمام الترمذي رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٢٩١٥] عن أَبِي هريرةَ رضي الله عنه -وحسنه الإمام الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ - عن النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ :

(( يجيء القرآن يوم القيامة فيقول : يا رب حلّه، فيلبس تاج الكرامة ، ثُمَّ يقولُ: يا ربِّ زده ، فيلبس حلّة الكرامة ، ثُمَّ يقولُ : يا ربِّ ارض عنه ، فيرضى عنه ، فيقالُ له : اقرأْ وارق ، ويزاد بكُلِّ آية حسنة )) .

[واتا] : (( له ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێت و دەڵێت : ئەی پەروەردگار خاوەنەکەم بڕازێنەوە ، ئەویش تاجی ڕێز و شکۆ دەکرێتە سەری ، پاشان قورئان دەڵێت : ئەی خودای پەروەرگار زیاتری بکە بۆی ، ئەویش جلوبەرگی ڕێز و شکۆ دەکرێتەبەری ، پاشان قورئان دەفەرموێت : ئەی پەروەرگار لێی ڕازیبە ، خودای گەورەش لێی ڕازی دەبێت ، پاشان پێی دەوترێت : قورئان بخوێنەوە و بەرزبەرەوە ، وە بە هەر ئایەتێکیش حەسەنەیەکی بۆ زیاد دەکرێت )) .

**٨- ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە بەجوانی ئەوە لەگەڵ مەلائیکەتەکاندایە :**

روى الإمام البخاري رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٤٩٣٧] عن عائشة رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهَا عن النَّبِيِّ ﷺ قال :

(( مثل الَّذي يقرأُ القرآنَ وهو حافظٌ له مع السَّفَرة الكرام البررة ، ومثل الَّذي يقرأُ وهو يتعاهده وهو عليه شديدٌ فله أجران )) .

[واتا] : (( نموونەی ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێتەوە و بەجوانی لەبەریەتی ئەوە لەگەڵ مەلائیکە بەڕێزە گوێڕایەڵەکاندایە ، وە نموونەی ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێتەوە و بەردەوام لە هەوڵدایە بۆ ئەوەی لەبیری نەچێتەوە و قورسە لەسەری ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە )) .

**٩- ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە لە قیامەتدا ماڵ و موڵك دەدرێتە دەستی ڕاستی ، نەمریش دەدرێتە دەستی چەپی ، دایك و باوکیشی جلوبەرگێکیان دەکرێتەبەر کە لە هەموو دونیا بەنرخترە :**

روى الإمام أحمد رَحِمَهُ ٱللَّهُ برقم [٢٢٩٥٠] عن بريدة رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ –وحسنه الإمام الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ– ، قَالَ : كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ:

(( وَإِنَّ الْقُرْآنَ يَلْقَى صَاحِبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِينَ يَنْشَقُّ عَنْهُ قَبْرُهُ كَالرَّجُلِ الشَّاحِبِ . فَيَقُولُ لَهُ : هَلْ تَعْرِفُنِي ؟ فَيَقُولُ : مَا أَعْرِفُكَ . فَيَقُولُ : أَنَا صَاحِبُكَ الْقُرْآنُ الَّذِي أَظْمَأْتُكَ فِي الْهَوَاجِرِ وَأَسْهَرْتُ لَيْلَكَ ، وَإِنَّ كُلَّ تَاجِرٍ مِنْ وَرَاءِ تِجَارَتِهِ ، وَإِنَّكَ الْيَوْمَ مِنْ وَرَاءِ كُلِّ تِجَارَةٍ ، فَيُعْطَى الْمُلْكَ بِيَمِينِهِ ، وَالْخُلْدَ بِشِمَالِهِ ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ ، وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لَا يُقَوَّمُ لَهُمَا أَهْلُ الدُّنْيَا ، فَيَقُولَانِ : بِمَ كُسِينَا هَذَا ؟ فَيُقَالُ : بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ . ثُمَّ يُقَالُ لَهُ : اقْرَأْ وَاصْعَدْ فِي دَرَجِ الْجَنَّةِ وَغُرَفِهَا ، فَهُوَ فِي صُعُودٍ مَا دَامَ يَقْرَأُ ، هَذًّا كَانَ، أَوْ تَرْتِيلًا )) .

[واتا] : (( بەڕاستی قورئان دەگات بە خاوەنەکەی هاوشێوەی پیاوێکی  لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك لە گۆڕەکەی دەردەچێتەدەرەوە ، قورئان پێی دەڵێت : ئایا تۆ من دەناسیت ؟ ئەویش دەڵێت : ناتناسم . قورئانیش دەڵێت : من هاوڕێکەتم قورئانم کە تۆم تینوو کردبوو لە گەرمای نیوەڕواندا و شەویش شەونخوونیم پێدەکردیت ، بەڕاستی هەموو بازرگانێك لە دوای بازرگانییەکەوەیەتی و بازرگانییەکەی خۆی پێشخستووە ، وە بەڕاستی تۆ ئەمڕۆ لە دوای هەموو بازرگانییەوەیەکی ماڵ و موڵکی پێدەدرێتە دەستی ڕاستی ، وە نەمریش دەدرێتە دەستی چەپی ، تاجی شکۆ و ڕێزیش دەکرێتەسەری ، دایك و باوکیشی دوو جلوبەرگیان دەکرێتەبەر کە لە هەموو دونیا بەنرخترە ، ئەوانیش دەڵێن : بەهۆی چییەوە ئەم جلوبەرگەمان کراوەتەبەر ؟ دەوترێت : بەهۆی فێرکردنی منداڵەکەتان بۆ قورئان . پاشان پێی دەوترێت بخوێنەوە و بەرزببەرەوە بە ژوور و پلەکانی بەهەشتدا ، ئەو لە بەرزبوونەوەدایە تاوەکو قورئان بخوێنێت ، بە خێرایی قورئان بخوێنێتەوە یاخود بە هێواشی )) .

# هەندێك بنچینە و یاسای گشتی بۆ لەبەرکردنی قورئان

١- ئیخلاص و نیازپاکی نهێنی سەرکەوتن و یارمەتیدانی خودای گەورەیە بۆ تۆ .

٢- گەورەیی قورئان لە دڵ و دەروونتدا هەست پێبکە ، هەوڵبدە لەسەر گەورەیی قورئان زانیاریت هەبێت بە خوێندنەوەی کتێب لەسەری .

٣- فەزڵ و گەورەیی پاداشتی قورئان لەبەرکردن بخوێنەوە لە ئیسلامدا .

٤- لەبەرکردنت لە تەمەنی منداڵیدا زۆر بەهێز و بەسوود دەبێت .

٥- کاتی موناسیب و گونجاو و پێویست بۆ کاتی لەبەرکردن هەڵبژێرە ، بە تایبەتی شەوان کاتی پارشێو ، لەگەڵ دوای فەجری ڕاستگۆ ، لەگەڵ سەعاتێك پێش خەوتن ، بەڵام پابەندی ئەو کاتەبە کە دیاریت کردووە بۆ لەبەرکردن یاخود موراجەعەکردن ، هەر ڕۆژە و لە کاتێکی جیاوازدا قورئان لەبەر مەکە یاخود موراجەعەی مەکە .

٦- شوێنێکی گونجاو و پاك و بۆن خۆش بۆ کاتی لەبەرکردن هەڵبژێرە ، ئاگات لەوە بێت لە کاتی لەبەرکردندا بە هیچ شێوەیەك مەشغوڵ نەبیت بەو شتانەی لە دەوروبەرتدایە ، وەك باڵەکانی پانکەی هەوا ، ئەو نەقشانەی لەسەر دیوار و فەرشەکانی دەوروبەرتدایە ، پەنجەرەی ژوورەکەت ، ڕێکردنی ئۆتۆمبێلەکانی دەرەوە ، و هەموو شتێکی سەرنج ڕاکێشیتر .

٧- صەبرگرتن لەسەر قورسی و ناڕەحەتی لەبەرکردن و موراجەعەکردنی قورئان.

٨- لەکاتی لەبەرکردن ئایەتەکان بخوێنەرەوە بە دەنگێك کە بە ئاشکرا ببیسترێت ، و بە تەجویدەوە بیخوێنەرەوە ، و لەسەر یەك شێوازی خێرایی بیخوێنەوە .

٩- هەڵبژاردنی موصحەفێکی تایبەت بە خۆت تاوەکو تەنها لەسەر ئەو موصحەفە قورئانەکە لەبەر بکەیت .

١٠- ڕاستکردنەوەی هەڵەی خوێندنەوەی قورئان پێش دەستکردن بە لەبەرکردن .

١١- ئەو ئایەتانەی لەبەرت کردووە پێکەوەیان ببەستەوە بە دەنگ و بینین .

١٢- زۆر دووبارەی بکەوە ئەو بڕە قورئانەی کە لەبەرت کردووە .

١٣- هەموو ڕۆژێك بڕێك دیاری بکە بۆ لەبەرکردن گەر کەمیش بێت بەڵام دانەبڕێیت بە هیچ شێوەیەك و لە هەر دۆخێکدابێت .

١٤- بە لەسەرخۆیی قورئانەکە لەبەربکە ، پەلەپەل مەکە لە لەبەرکردن بۆ ئەوەی بەباشی بچەسپێت لە یادگە و مێشکتدا .

١٥- ئاگات لەو ئایەتانە بێت کە موتەشابیهن ، تەرکیزیان بخەرە سەر تاوەکو لێت تێك نەچێت .

١٦- گەر هەبوو با مامۆستایەکت لەگەڵ بێت لەکاتی لەبەر کردنەکەت .

١٧- گەر مامۆستات نەبوو بۆ لەبەرکردن ئەوا هەفتانە کاتێك دیاری بکە لای مامۆستایەکی شارەزا بە تەجوید هەموو ئەو بڕەی لەو هەفتەیەدا لەبەرت کردووە بەسەریدا بیخوێنیتەوە ، هەرچەند شارەزاش بیت ئەگەر هەیە هەڵەت هەبێت بەڵام خۆت هەستت پێنەکردبێت .

١٨- بەجوانی وێنەی نووسینی ئایەتەکانت لە پێش چاوبێت و تەرکیزی لەسەر بکە بۆ ئەوەی وێنەکەی بەردەوام لە پێش چاوت بێت لەکاتی موراجەعەدا .

١٩- هەرچەند ئایەتت لەبەرکرد کار و کردەوەیان پێبکە و ڕێنماییەکانیان جێبەجێ بکە .

٢٠- دووبارەکردنەوەیەکی ڕێکخراو بەوەی هەموو ڕۆژێك کاتێك بۆ دووبارەکردنەوەی ئەو بڕە دیاری بکەیت کە لەبەرت کردووە ، ئەم هەنگاوە هیچی کەمتر نییە لە هەنگاوی لەبەرکردنەکەت .

٢١- تێگەیشتن لە تەفسیری ئەو ئایەتانەی دەتەوێت لەبەری بکەیت یارمەتیت دەدات بۆ لەبەرکردن ، کە ماناکەیت زانی ئەوە وشەکان زیاتر ئاشنادەبن بە مێشکت .

٢٢- هیممەتی ڕاستەقینەت هەبێت بۆ لەبەرکردن ، هەوڵی تەواوەتی بۆ بدە .

٢٣- دوعا کردن و داواکردن لە خودای گەورە یارمەتیت بدات بۆ لەبەرکردن .

٢٤- نووسینەوەی ئەو ئایەتانەی لەبەرت کردووە بەوشێوەیەی کە لە موصحەفدایە.

٢٥- زۆر لە خۆت مەکە بۆ لەبەرکردن ، ئەوەندە لەبەربکە لە توانای خۆتدابێت .

٢٦- ئەو بڕە قورئانەی لەبەرت کردووە لە شەونوێژ و نوێژە سوننەتەکاندا بیخوێنە.

٢٧- تەقوای خودای گەورەت هەبێت ، وە تەوبە بکە لە هەموو تاوانەکان ، و دوورکەوە لە تاوانەکان گەر تاوانی بچووکیش بێت ، چونکە تاوان ئیمان لاواز دەکات .

٢٨- زۆر زیکر و یادی خودای گەورە بکە بە هەموو جۆرەکانی زیکر ، بەتایبەتی استغفار و داوای لێخۆشبوون لە خودای گەورە .

٢٩- دانانی سزا و پاداشت بۆ لەبەرکردن لەلایەن مامۆستاوە ، یاخود گەر مامۆستا نەبوو خۆت سزا و پاداشت دابنێ بۆ خۆت ، سرووشتی مرۆڤ وایە بە پاداشت چالاکتر دەبێت ، بە سزاش کەموکورتییەکانی پڕەکاتەوە گەر تووشی کەموکورتی هات .

٣٠- دوورکەوتنەوە لەو هۆکارانەی کە مێشك ماندوو دەکەن ، فکر مەشغوڵ دەکەن بە تایبەت تەلەفیزیۆن ، موبایل ، کۆمپیوتەر ، ئەنتەرنێت بە گشتی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەتی وەك : فەیس بووك ، تویتەر ، یوتیوب جگە لەمانەش .

٣١- مێوژ بەسوود و گرنگە بۆ لەبەرکردن ، ڕۆژانە بەیانیان (٢١) دانە مێوژ بخۆ.

٣٢- زۆر خواردن دەبێتە هۆی زوو بیرچوونەوە و نەمانی توانای لەبەرکردن ، وە ئەو کاتانەی کە تا ڕادەیەك برسیت باشترە بۆ لەبەرکردن وەك لەو کاتانەی کە تێریت .

٣٣- زۆر خوێندنەوە و گوێگرتنی قورئان لەسەر موصحەف .

٣٤- خوێندنەوەی ژیاننامەی گەورە زانایانی ئیسلام کە بە شێوازی زۆر سەیر لەبەرکردنیان هەبووە و شتەکانیان لەبەرکردووە بە ماوەیەکی کەم بە تایبەت قورئان .

٣٥- بانگەوازی و گەیاندنی ئەو بڕەی قورئان کە لەبەرت کردووە ، چۆن ماڵ بە خێر و صەدەقە زیاد دەکات ، عیلم و زانستیش بە گەیاندن و بانگەوازی بۆکردنی زیاد دەکات ، لەبەرکردنیش باشترین عیلم و زانستە گەر خودای گەورە تێگەیشتن و فیقهیشی لەگەڵدا پێت ببەخشێت .

٣٦- ڕۆنەچوون بەناو خۆشی دونیادا ، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی موسوڵمان غافڵ و بێئاگا دەکات لە دیین و قیامەت ، ئەوەش وادەکات نەتوانیت قورئان لەبەر بکەیت .

٣٧- دەست نەکردن بە لەبەرکردنی ئایەتی تازە تاوەکو بە تەواوەتی ئەو ئایەتەی دەتەوێت لەبەری بکەیت کۆنترۆڵی نەکەیت بەجوانی ، زیادکردنی بڕی تازە بێ کۆنترۆڵکردنی ئەوا زیانی زیاترە .

٣٨- بەفیڕۆ نەدانی ئەو کاتانەی کە دەستت تێیدا بەتاڵە ، یاخود دەستت بەتاڵ نییە تێیدا بەڵام دەتوانیت قورئانی تێدا بخوێنیت بە لەبەر ، ئەو کاتانە زۆر یارمەتیدەرە بۆ چەسپینی ئەو بڕەی قورئان کە لەبەرت کردووە بەشێوەیەك هەمیشە لەیادت بمێنێتەوە .

٣٩- خوێندنی یەك جوزئی قورئان ڕۆژانە لەسەر موصحەف ، بەشێوەیەك هەموو ڕۆژێك هەمان جوزئی قورئان بخوێنەوە تاوەکو بەگوێرەی بەرنامەکەت تەواوی ئەو جوزئە لەبەردەکەیت .

بۆ نموونە : خەریکی لەبەرکردنی جوزئی یەکەمی ، ڕۆژانە یەك لاپەڕە لەبەردەکەیت ، ئەوا هەموو ڕۆژێك هەموو جوزئی یەکەم لەسەر موصحەف بخوێنەوە تاوەکو هەموو جوزئی یەکەم لەبەردەکەیت لەماوەی (٢٠) ڕۆژدا ، ئەوکات دەڕۆیتە جوزئی دووهەم بۆ لەبەرکردن ، ئەوجا بەهەمانشێوەی جوزئی یەکەم هەموو ڕۆژێك جوزئی دووهەم هەمووی بخوێنەوە لەسەر موصحەف تاوەکو هەموو جوزئی دووهەمیش لەبەردەکەیت لەماوەی (٢٠) ڕۆژدا ، بەمشێوەیە بەردەوامبە .

٤٠- ئاگات لەو وشانەبێت کە قورسن لەسەرت بۆ لەبەرکردن ، ئاماژەی لەسەردانێ تاوەکو زیاتر گرنگی پێبدەیت و وریای هەڵەکردن بیت تێیدا ، هەوڵبدە ئەو وشانە لە هەر ئایەتێك هەبوو (٣٠) جار یان زیاتر ئایەتەکە بخوێنەوە دوای ئەوەی ئایەتەکەت لەبەرکرد .

٤١- خۆشویستنی قورئان ، بەوەی هەمیشە لەگەڵ قورئاندا بژیت ، بەبێ قورئان ژیانت تاڵ و ناخۆش بێت ، گەر بگەیت بەم پلەیە لەخۆتەوە دەتەوێت لەبەری بکەیت .

# هەنگاوەکانی لەبەرکردنی قورئان

١- پێش دەستکردن بە لەبەرکردنی هەر ئایەتێك کە دەتەوێت لەبەری بکەیت تەفسیرەکەی بخوێنەوە لەسەر تەفسیرێکی باش زیاتر لە (٣) جار ، تاوەکو ماناکەی بە جوانی کۆنترۆڵ بکەیت .

٢- ئەو موصحەفەی کە هەڵتبژاردووە و دیاریتکردووە بۆ لەبەرکردن لەسەری .

٣- ئامادەکردنی ئەو دانیشتنەی کە دەتەوێت لەبەرکردنی تێدا ئەنجام بدەیت ئەویش بەمشێوەیەی خوارەوە :

أ- خۆ ئامادەکرنی دەروونی بەوەی کە نیەتی خێر و ئارەزووی لەبەرکردنی قورئان بێنیتەوە یادت .

ب- دەستنوێژگرتن و خۆ پاککردنەوەی تەواو لە هەموو پیسیەك .

ت- دانیشتن لەو شوێنەی کە دەروونت تێیدا ئاسوودە دەبێت .

پ- ئەو شوێنەی تێیدا لەبەر کردنەکە دەکەیت با نەقش و ڕەنگی زۆر تێدا نەبێت ، شوێنێك بێت مەشغوڵت نەکات .

ج- ڕوو کردنە قیبلە و دانیشتن بە شێوەیەکی جوان و سەنگین و سەلار .

٤- سەرەتا پێش دەست کردن بە لەبەرکردن هەندێك قورئان بخوێنەوە بۆ ماوەی (٥) دەقیقە ، وەك چۆن پێش یاریکردن هەندێك خۆگەرم کردن و احماء دەکرێت تاوەکو کەسەکە ڕابێت لەسەر یاریەکە و تووشی پێکان نەبێت ، دوای ئەم ماوە قورئان خوێندنە هەست دەکەیت زۆر بەپەرۆشی بۆ لەبەر کردنی قورئانەکە ، ئەوجا دەست بکە بە لەبەرکردن

٥- ئەو ئایەتانەی دەتەوێت لەبەریان بکەیت گوێیان لێبگرە بە دەنگی (محمد صديق المنشاوي) (٣) جار یان زیاتر ، لەگەڵ گوێگرتنەکەش سەیری وشەکان بکە لەسەر موصحەفدا ، تاوەکو وشەکان ئاسان ببنەوە لەسەرت ، و بەجوانی و دروستی بیخوێنیتەوە .

٦- پاشان گەر بتوانیت ئەو بڕەی دەتەوێت لەبەری بکەیت بە دەنگی خۆت تۆماری بکە لە مۆبایلەکەتدا ، دواتر (٣) جار یان زیاتر گوێی لێبگرەوە بەڵام لەگەڵ گوێگرتنەکەش سەیری وشەکان بکە لەسەر موصحەفدا ، ئەم ڕێگایە زۆرێك لەوانەی لە بواری لەبەرکردنی قورئان شارەزاییان هەیە پێشنیاری دەکەن بۆ ئەوانەی دەیانەوێت قورئان لەبەر بکەن ، چونکە دەنگی خۆت ئاشناترە لە دەنگی هەرکەسێکیتر بۆ مێشك و دڵ و عەقڵت ، بەوەش خێراتر دەچەسپێت لە یادگەتدا -زاکیرەتدا- .

٧- پێویستە زۆر بە تەرکیز سەیری ئەو ئایەتانە بکەی کە دەتەوێت لەبەریان بکەیت ، وەك چۆن کامێرایەك تەصویری ئەو پەڕەیە بکات ، نەکەی تەرکیزی چاوت لابەی لەسەر ئایەتەکان .

٨- مێشکت خاڵی بکەوە لە هەموو بیرکردنەوەیەك ، هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە ، ئەوجا دەست بکە بە خوێندنەوەی یەکەم ئایەت بەصەوتێك کە ببیسترێت بە ئاشکرا و بە تەجویدەوە بێت، خێرا مەیخوێنەرەوە ، بە صەحیحی ئایەتەکە بخوێنەرەوە ، و ئایەتەکە (٢٥) جار یان زیاتر بخوێنەوە بەوشێوەیە تاوەکو بە تەواوی هەستدەکەیت لەبەرت کردووە، پاشان چاوت بنوقێنە و خەیاڵی وشەکان بکە ، بزانە وشەکان لە چ شوێنێکی موصحەفەکەدایە ، و بیخوێنەوە بە چاو نوقاوییەوە .

ئەگەر بەتەواوی شوێنی ووشەکانت زانی و بە صەحیحی خوێندتەوە ، ئەوە (٥) جاری تریش بەوشێوەیە دووبارەی بکەوە بە چاو نوقاوییەوە .

ئەگەر بە تەواوی شوێنی وشەکانت نەزانی و تەنانەت یەك وشەشت بە هەڵە خوێندەوە ، ئەوا جارێکی دیکە تەرکیز بخەرەوە سەر ئایەتەکە و (٢٥) جار یان زیاتر بیخوێنەوە بە

دەنگ و تەجویدەوە تاوەکو بە تەواوی هەستدەکەیت لەبەرت کردووە ، پاشان چاوت بنوقێنە و خەیاڵی وشەکان بکە ، بزانە وشەکان لە چ شوێنێکی موصحەفەکەدایە ، بیخوێنەوە بە چاو نوقاوییەوە ، ئەگەر بەتەواوی شوێنی ووشەکانت زانی و بە صەحیحی خوێندتەوە ، ئەوە (٥) جاری تریش بەوشێوەیە دووبارەی بکەوە بە چاو نوقاوییەوە ، بەوەش بە تەواوی شوێنی وشەکان دەچەسپێت لە مێشکتدا .

٩- پاشان چاوت بکەوە و (٥) جار ئایەتەکە بخوێنەوە لەسەر موصحەفەکە تا دڵنیابیتەوە کە ئایەتەکەت بە تەواوی لەبەر کردووە ، ئەگەر سەدا سەد ١٠٠٪ دڵنیابوویتەوە و زانیت لەبەرت کردووە بەتەواوی ئەوا دووبارە (٥) جاریتر چاوت بنووقێنە و بیخوێنەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی بچەسپێت .

١٠- دوای ئەوە بڕۆ بۆ لەبەرکردنی ئایەتەکەی دوای ئایەتی یەکەم بە هەمان ئەو ڕێگایەی ئایەتی پێشوو کە باسمان کرد چۆن لەبەری بکەیت .

١١- ئەگەر ئایەتێك درێژ بوو دابەشی بکە بۆ چەند بەشێك ، وە هەر بەشێك لەو بەشانە وەك ئایەتی یەکەم هەنگاوەکان جێ بەجێ بکە .

١٢- پاشان هەستە بە ئەنجامدانی گرێدان و بەستنەوەی ئایەتەکان بەیەك وەك پێشتر لە یاساکان باسمان کرد ، بەوشێوەیەی کە کۆتایی ئایەتی یەکەم بە سەرەتای ئایەتی دووهەم بگەیەنیت بەبێ وەستانی خوێندنەوە لە نێوان ئایەتی یەکەم و دووهەم ، با دەنگت ببیسترێت بە ئاسانی و بە تەجویدەوە بێت ، ئەم شێوەیە (١٠) جار دووبارە بکەوە بەخوێندنەوەی لەسەر موصحەف ، پاشان ئەم شێوەیە (١٠) جار دووبارە بکەوە بە خوێندنەوەی ئایەتەکان بە لەبەر ، بەمشێوەیە دوو ئایەتت بە تەواوی لەبەر کرد و بەیەکیانت بەستەوە زۆر بەجوانی .

نموونە : ئایەتی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَٰلَمِينَ ①﴾ ئایەتی یەکەمە ، بەوشێوازەی سەرەوە لەبەرکراوە ، ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ②﴾ ئایەتی دووهەمە ، هاوشێوەی ئایەتی یەکەم لەبەرکراوە ، کە بمانەوێت بەیەکیانەوە ببەستین ئەوا ئایەتی یەکەم دەخوێنینەوە تاوەکو کۆتاییەکەی ، پاشان ڕاستەوخۆ ئایەتی دووهەم تاکۆتاییەکەی دەخوێنیەوە تا کۆتایەکەی .

بەمشێوەیە چەند ئایەتمان لەبەرکرد هاوشێوەی ئەم دوو ئایەتە لەبەریان دەکەین و بەیەکیانەوە دەبەستین لە یەکەم ئایەتەوە بۆ کۆتا ئایەت کە لەبەرت کردووە ئەو ڕۆژە ، تاوەکو لەبەرکردنەکەمان پتەو و بەهێزبێت ، بە ئاسانی لەبیرمان نەچێتەوە .

هەر کە لە لەبەرکردن تەواو بوویت ، بۆ نموونە پێنج ئایەتت لەبەرکرد و پێکەوەت گرێدا هەموویان لە ئایەتی یەکەمەوە بۆ ئایەتی پێنجەم بەوشێوەیەی باسمان کرد ، ئەوجا لە کۆتا ئایەتەوە (ئایەتی پێنجەم) دووبارە ئەوەی لەبەرت کردووە پێکەوە گرێی بدە لەگەڵ ئایەتەکانی پێش خۆی ، ئەویش بەمشێوەیەی خوارەوە :

بەوشێوەیەی کە کۆتایی ئایەتی چوارەم بە سەرەتای ئایەتی پێنجەم بگەیەنیت بەبێ وەستانی خوێندنەوە لە نێوان ئایەتی چوارەم و پێنجەم ، با دەنگت ببیسترێت بە ئاسانی و بە تەجویدەوە بێت ، ئەم شێوەیە (١٠) جار دووبارە بکەوە بەخوێندنەوەی لەسەر موصحەف ، پاشان ئەم شێوەیە (١٠) جار دووبارە بکەوە بە خوێندنەوەی ئایەتەکان بە لەبەر ، پاشان کۆتایی ئایەتی سێهەم بە سەرەتای ئایەتی چوارەم بگەیەنیت بەبێ وەستانی خوێندنەوە لە نێوان ئایەتی سێهەم و چوارەم بەوشێوەیەی سەرەوە ، هەر بەمشێوەیە بەردەوام دەبیت تاوەکو دەگەیتەوە بە یەکەم ئایەت .

**تێبینی** : ئەم شێوازی گرێدان و پێکەوە بەستنە بۆ کۆتایی هەموو لاپەڕەیەك لەگەڵ سەرەتای لاپەڕەکەی دوای ئەودا ئەنجامبدە ، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کۆتایی و سەرەتای لاپەڕەکان بکەیت بەجوانی .

١٣- پاشان تەوەکول و پشت ببەستە بە خوای گەورە لە هەموو هەنگاوێکی لەبەر کردنەکان ، هەوڵ بدە زۆر بە توندوتۆڵی ئەم هەنگاوانە جێ بەجێ بکە باشترین ڕێگای لەبەر کردنە کە زۆر بە باشی دەچەسپێت ئەم جۆرە ڕێگایە لە مێشکدا .

١٤- بۆ ئەوەی بە باشی و بە تۆکمەیی لەبەرکردنەکەت تەواو بکەیت ئەوا ئەو بڕەی لەبەرت کردووە ئەو ڕۆژە لە سەرەتاوە بۆ کۆتاکەی (١٠) جار دووبارەی بکەوە .

١٥- تاوەکو دووبارەکردنەوەکانی هەر هەنگاوێك لەو هەنگاوانەی سەرەوە پێیدا ڕۆشتین زیاتر و زۆرتربێت ئەوا لەبەرکردنەکەت چەسپاوتر و باشتر دەبێت ، تاوەکو کەمتریش دووبارەی بکەیتەوە لەبەرکردنەکەت لاوازتر و ناجێگیرتر دەبێت .

١٦- کۆتا هەنگاوی لەبەرکردنەکەت با ئەوەبێت کە (٢) جار ئەو بڕەی لەبەرت کردووە بنووسیتەوە بە دەست ، بەڵام تاوەکو دەتوانیت لەسەر ئەو موصحەفانە بینووسیتەوە کە تایبەتن بە نووسینەوەی قورئان باشترە ، چونکە ئەو موصحەفانە لەسەر دیزاین و شێوازی موصحەف دیزاین کراوە بەڵام ئەوەی تێدایە کە هیچ قورئانی تێدا نەنووسراوەتەوە ، بەڵکو تەنها دیزاین کراوە بۆ ئەوەی قورئانی تێدا بنووسرێتەوە ، ئەمەش وا دەکات هەمیشە شوێنی وشەکان بزانیت لە کوێی موصحەفدایە .

# ڕێگای دووبارەکردن و موراجەعەکردنی قورئانی لەلایەن خۆتەوە

کرداری دووبارەکردنەوەی قورئان دابەش دەبێت بۆ (٢) قۆناغ :

**قۆناغی یەکەم** : قۆناغی دەستپێکردنی لەبەرکردنی قورئان ، بەوەی لەسەرەتاوە دەستپێبکەیت تاوەکو بە تەواوەتی تەواو دەبیت لە لەبەرکردنی قورئان ، ئەوا ڕێگاکانی دووبارەکردنەوە بەمشێوازانەی خوارەوە دەبێت :

١- پێش هەموو شتێك ئەو بڕەی ڕۆژی پێشتر لەبەرت کردووە (١) جار یان زیاتر گوێی لێبگرە بە دەنگی (محمد صدیق المنشاوي) تاوەکو باشتر بێتەوە یادت و بچەسپێت .

٢- ئەو قورئانەی بە دەنگی خۆت تۆمارت کردووە لە موبایلەکەتدا لە کاتی موراجەعەشدا (١) جار یان زیاتر گوێی لێبگرەوە .

٣- وایدائەنێین کە ئەمڕۆ ڕۆژی پێنجشەممەیە ، ئەو بڕەی ڕۆژی چوارشەممە لەبەرت کردووە (٢٥) جار دووبارەی بکەوە، بۆ ئەوەی لە یادگەتدا -زاکیرەتدا- بمێنێتەوە .

دوای دووبارەکردنەوەی ئەو بڕەی ڕۆژی چوارشەممە لەبەرت کردووە ، ئەوجا ئەو بڕەی ڕۆژی سێشەممە لەبەرت کردبوو (٢٠) جار دووبارەی بکەوە .

دوای دووبارەکردنەوەی ئەو بڕەی ڕۆژی سێشەممە لەبەرت کردبوو ، ئەوجا ئەو بڕەی ڕۆژی دووشەممە لەبەرت کردبوو (١٥) جار دووبارەی بکەوە .

دوای دووبارەکردنەوەی ئەو بڕەی ڕۆژی دووشەممە لەبەرت کردبوو ، ئەوجا ئەو بڕەی ڕۆژی یەکشەممە لەبەرت کردبوو (١٠) جار دووبارەی بکەوە .

دوای دووبارەکردنەوەی ئەو بڕەی ڕۆژی یەکشەممە لەبەرت کردبوو ، ئەوجا ئەو بڕەی ڕۆژی شەممە لەبەرت کردبوو (٥) جار دووبارەی بکەوە .

که گەشتیتە ڕۆژی هەینی ، ئەو بڕەی ڕۆژی پێنجشەممە لەبەرت کردووە دووبارەی دەکەیتەوە ، بەهەمانشێوەی سەرەوە وانەکانی پێشوو دووبارە دەکەیتەوە ، بەڵام لەسەرەوە کۆتا وانە کە دووبارەت دەکردەوە وانەی ڕۆژی شەممە بوو ، بەڵام ئەمڕۆ کۆتا وانەت کە دووبارەی دەکەیتەوە وانەی ڕۆژی یەکشەممەیە ، چونکە وانەیەکی تازەت خوێندووە ، بەوەش هەر جارە و وانەیەکی تازەت خوێند ئەوا کۆتا وانە لادەبەیت و وانەکەی پێش خۆی دەخەیتە شوێنەکەی .

بەمشێوەیە تۆ ڕۆژانە (٥) وانەی پێشوو دووبارە دەکەیتەوە ، ئەمەش زیاتر و زیاتر لەبەرکردنەکەت جێگیر و چەسپاو دەکات ، هەر بڕە قورئانێکیش لەبەری دەکەیت ئەوا لە ماوەی (٥) ڕۆژدا زیاتر لە (٨٥) جار دووبارەی دەکەیتەوە وەك موراجەعە ، ئەمە بێجگە لەوەی لەناو نوێژ ، و کاتی دەستبەتاڵیتدا چەندینجاریتر دووبارەی دەکەیتەوە ، بێجگە لەوەشی لەکاتی لەبەرکردنەکەشتدا هەر ئایەتێك زیاتر لە (٧٥) جار دووبارەت کردۆتەوە ، ئەمەش وادەکات لەبەرکردنەکەت زۆر تۆکمە و جێگیربێت ، و بە ئاسانی لەبیرت نەچێتەوە ، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو خێر، و بەرەکەت ، و چاکە ، و حەسەناتانەی لە قورئان خوێندندا دەستت دەکەوێت ، کە هەر حەرفێك (١٠) حەسەنات و چاکەیە .

تۆ لە ماوەی (٥) ڕۆژدا هەر ئایەتێك لەبەرت کردبێت زیاتر لە (١٦٠) جار خوێندووتەتەوە و کە تەنها گەر ئایەتی دووهەمی سوورەتی بەقەرە :

﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ هەژمار بکەین دەبینین (٢٩) حەرفە ، کە تەنها ئەم ئایەتە دەکاتە (٤,٦٤٠) حەرف چونکە هەر ئایەتێك (١٦٠) جار خوێندووتەتەوە ، کە ئەمەش لێکدانی (١٠)ی بکەین کە پاداشتی هەر حەرفێکی قورئانە ، دەبینین دەکاتە ژمارەیەکی یەکجار گەورە لە حەسەنات و چاکە ، (٤٦,٤٠٠) چاکە و

حەسەنات تەنها لە ماوەی (٥) ڕۆژدا ، ئەمە جگە لە خێر و چاکە و فەزڵ و حەسەناتی لەبەرکردنی قورئان و فێربوونی تەفسیرەکەی !!!

ئەمە چ فەزڵ ، و نیعمەت ، و بەخشش ، و سامانێکی قیامەتی، و گەورەیی ، وئیحسانێکە لە فێربوون ولەبەرکردنی وتەی خودای گەورە و میهرەبانمان ، ئەم هەموو حەسەناتە تەنها لە یەك ئایەتی کورتتدا هەیە ، دەبێت چ فەزڵ ، و حەسەناتێك لە هەموو قورئاندا هەبێت بۆ کەسێك بیەوێت قورئان لەبەر بکات !!!

٤- هەر وشەیەك هەڵەت تێدا کردبوو لە کاتی لەبەرکردندا ، یاخود قورس بوو بەلاتەوە ، ئەوا لە کاتی موراجەعەدا ئەو ئایەتی ئەو وشەیەی تێدایە (٥٠) جار دووبارە بکەوە ، بۆ ئەوەی هەرگیز هەڵەی تێدا نەکەیتەوە .

٥- خوێندنەوەی ئەوەی لەبەرت کردووە لە ناو نوێژەکان :

أ- لەکاتی شەو نوێژدا بیخوێنیت کاریگەری هەیە لەسەر چەسپاندنی ئایەتەکان لە مێشکتدا .

ب- لە کاتی نوێژە فەرزەکان کە ئیمام دەنگی بەرز ناکاتەوە ، واتا نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسر .

٦- سوود وەرگرتن لەو کاتانەی کە هیچ سوودێکی لێ نابینیت وەك کاتی ڕۆشتن بۆ مزگەوت ، قوتابخانە، سەرەی نان ، بازاڕ ، فەرمانگە یان هەر شوێنێکی تر ، بۆ ئەوەی بە بەتاڵی نەڕوات بە دووبارەکردنەوەی قورئان پڕی بکەوە هەم لەبەرکردنت بەهێز دەکات هەم پاداشتێکی زۆری هەیە ، خۆ گەر نەتتوانی بە زمان دووبارەی بکەیتەوە ئەوا بە گوێ دووبارەی بکەوە لە ڕێگای گوێ گرتن لە قورئان .

٧- ئەو بڕەی ئەمڕۆ لەبەرت کرد ، هەوڵبدە بەردەوام لەگەڵ خۆتدا دووبارەی بکەوە ، لە نوێژە فەرز و سوننەتەکانی ئەو ڕۆژەت تەنها ئەو بڕە بخوێنە ، ئەوە زیاتر چەسپاوت دەکات لەسەر لەبەرکردن .

٨- هەموو ڕۆژێك (١) جار یاخود زیاتر تەواوی ئەو بڕە قورئانەی لەبەرت کردووە موراجەعەی بکەوە گەر نەگەشتۆتە (٥) جوزء زیاتر ، خۆ گەر زیاتر بوو لە (٥) جوزء ئەوا ڕۆژانە دەتوانرێت (١) جار دووبارە بکرێتەوە .

٩- هەر سوورەتێکت بە تەواوی لەبەرکرد ئەوا هەموو سوورەتەکە (٣) جار موراجەعە بکەوە بۆ ئەوەی بزانیت هەڵەت هەیە تێیدا یاخود نا ، گەر هەڵەت نەبوو ئەوە دەستبکە بە لەبەرکردنی سوورەتی دواتر ، گەر هەڵەشت هەبوو تاوەکو هەڵەکان ڕاستنەکەیتەوە مەڕۆرە سوورەتی دواتر .

١٠- هەر بڕێکت لەبەرکرد ئەوا لەکاتی موراجەعەدا ئەو بڕەی ڕۆژی پێشتر لەبەرت کردووە (٣) جار بنووسەرەوە بە لەبەر ، خۆ گەر لەسەر ئەو موصحەفانە بینووسیتەوە کە تایبەتن بە نووسینەوەی قورئان باشترە ، چونکە ئەو موصحەفانە لەسەر دیزاین و شێوازی موصحەف دیزاین کراوە بەڵام ئەوەی تێدایە کە هیچ قورئانی تێدا نەنووسراوەتەوە ، بەڵکو تەنها دیزاین کراوە بۆ ئەوەی قورئانی تێدا بنووسرێتەوە بە دەست ، ئەمەش وا دەکات شوێنی وشەکان بزانیت لە کوێی موصحەفدایە .

١١- گەر موراجەعەت زۆر بوو ئەوکات پێویستە لەسەر شێوازی حەدر قورئانەکە بخوێنیتەوە لە کاتی موراجەعەدا ، واتا بەشێوازی خێرا خوێندنەوە .

**قۆناغی دووهەم** : قۆناغی تەواوبوون لە لەبەرکردنی قورئان ، بەوەی هەموو قورئانت لەبەرکردبێت ، ئەوا ڕێگاکانی دووبارەکردنەوە بەمشێوازانەی خوارەوە دەبێت :

١- دابەشکردنی قورئان بۆ (٣) بەش ، واتا ڕۆژی (١٠) جوزء قورئان بخوێنیت .

٢- دابەشكردنی قورئان بۆ (٤) بەش ، واتا ڕۆژی (٧.٥) حەوت جوزء و حزبێك .

٣- دابەشكردنی قورئان بۆ (٥) بەش ، واتا ڕۆژی (٦) جوزء قورئان بخوێنیت .

٤- دابەشكردنی قورئان بۆ (٦) بەش ، واتا ڕۆژی (٥) جوزء قورئان بخوێنیت .

٥- دابەشكردنی قورئان بۆ (٧) بەش ، واتا ڕۆژی (٤.٢) چوار جوزء و نیو حزب.

٦- دابەشكردنی قورئان بۆ (١٠) بەش ، ئەمەش واتا ڕۆژی (٣) جوزء قورئان .

٧- تایبەت كردنی هەندێك لە قورئان لە كاتێكی دیاریكراودا ، (٣) جوزء یان زیاتر دیاری بكە و لە ماوەی هەفتەیەكدا هەموو ڕۆژێك ئەم (٣) جوزء دووبارە دەكەیتەوە ، پاشان (٣) جوزئی دوای ئەو (٣) جوزئەكەیتر دیاری دەكەی وەك (٣) جوزئی یەكەم دووبارەی دەكەیتەوە ، ئەمەش وەك خاڵی (٦) وایە بەڵام بەشێوەیەكیتر .

٨- (٢) دانە خەتمە دەست پێدەكەیت لە یەك كاتدا :

یەكەمیان : (٢) جوزء بۆ ماوەی (١) هەفتە هەموو ڕۆژێك دووبارەی بكەوە .

دووەمیان : ڕۆژی (١) جوزء ، بەڵام هەموو ڕۆژێك جوزئێكی تازە دەخوێنیت .

بەمشێوەیە ڕۆژانە (٣) جوزء قورئانت دووبارە كردەوە ، وە لە ماوەی (١) مانگدا (١) جار قورئانت تەواو كرد ، و (٨) جوزئت بە باشی كۆنترۆڵ كردووە .

٩- هەموو ڕۆژێك (١) جوزء دەخوێنیت ، و لە ماوەی (١) مانگدا قورئان دووبارە دەكەیتەوە بە تەواوی، وە نابێت لە (١) جوزء كەمتر ڕۆژانە دووبارە بكەیتەوە ، بەڵكو ئەمە بۆ كەسانی تەمەڵە .